


نامیلکەی

# چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەر ﷺ


ئامادەکردنی بیلال سەرکەوت
پێداچوونەوەی مامۆستا حیکمەت تۆفیق
دیزاینی بەرگ سوڵتان محمد

إِنَّ الحَمْدَ للّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ بِاللّهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ… أَمَّا بَعْدُ: پێشه كی باوەڕداری خۆشەویست: لای هەمووان ڕوون وئاشكرایه كه (نوێژ) پلەیه كی زۆر گەورەو گرنگی هەیه لەئیسلامدا، زیاتر لەپەرستشه كانی تر، وەبنچینەی ئیسلامه لەدوای شایەتی دان بەتاكو تەنهای خوای پەروەردگار، وەپێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (صلی اللّه علیه وسلم) وە (نوێژ) كۆڵه گەی دینه، بەشی مرۆڤ لەدینه كەیدا بەستراوە بەپەیوەست بوون و گرنگی دان به نوێژ) ە كانیەوە، وە كۆڵه گەو بنچینەی هەموو ئایینه كانی پێش ئایینی ئیسلام بووە، وە) كۆنترین پەرستشه كه پێویست كرابێت لەسەر مرۆڤه كان، وەخوای پەروەردگار پێو یستی كردووە لەسەر هەموو پێغەمبەران(علیهم الصلاه والسلام) كەبەئوممەته كانیان ڕابگه یێنن وە گرنگی پێبدەن، وەپەیوەست بن به ئەنجامدانییەوە ئەمیش هەمووی لەبەر گەورەیی ( نوێژ) ە چونكه هیچ كردەوەو پەرستشێك نی یه وەكو (نوێژ) كاریگەری هەبیت لەسەر دڵ و دەروون وەپاك كردنەوەیان، وەیه كەم پەرستشه كەپێویست كرابێت لەسەر ئو ممەتی پێغەمبەر(صلی اللّه علیه وسلم) وەیه كەم پەرستشه كه لەسەروی (حەوت) ئاسمانەوە

پێویست کرابێت، وه نیشانەی هەره گەورەیە کەباوەڕداری پێ جیاده کرێتەوه لەبێ باوەڕ، وەخوای پەروەرد گار کردوویەتی بەبنەوایەك بۆ جێگیر بوونی برایەتی لەنێوان بڕواداراندا، وەیە کەم پرسیاره کەلەڕۆژی دوایی لەمرۆڤە کان ده کرێت، وەیە کەم نیشانەیە کەباوەڕداری پێ دەناسرێتەوه لەڕۆژی دواییدا، وەخوای پەروەرد گار ئەنجام نەدانی ئەم پەرستشەی بەهۆ کارێك باسکردووه بۆ ڕۆیشتنە ئاگری دۆزەخ خوا پەنامان بدات. بویە لەم نامیلە ک بتخوتیک لەچۆنیەتی نوێژی پێغەمبەری خوا صلی اللّٰه علیه وسلم باسکرڕدووه بەهیوای ئەو سوودمەندبین لێ

ئامادە کردنی بیلال سەر کەوت

پێداچونەوەی مامۆستا حیکمەت تۆفیق

# چۆنــیــەتــی فــێربــوونــی دەســـت نــوێــژ و نوێژ کـردن

## ئـادابــەکــانی دەســـت بــە ئاو گــەیــانــدن

یەکەم: چـونـە سـەر ئـاو (الدخول الخلاء)کاتێک دەچیتە سەر ئاوە دەبێت قاچی چەپت پێشبخەیت اللهم إني أعوذ بک من الخبث والخبائث) رواه البخاري (142) واتە: خودایە پەنات پێ دەگرم لە جنۆکە ی نێر و مێ

دووەم: هاتنـەدەرەوە لە سـەرئاو(الخروج من الخلاء) هەرکاتێک لەسەر ئاوبیت ویستت بێتە دەرەوە دەبێت لەپێش دا قاچی راست پێش دەخەیت هاتیتە دەرۆ دەڵێت (غُفْرَانَکَ) واتە:خوایە لێم خۆشبە

## قــەدەغـەلـێکراوەکـانی ســەرئـاو

یەکەم: نابێـت نـە ڕووت نە پشـت رووی لەقیبلە بێت. پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەر موویەتی (إذا أتيتم الغائط فلا تستقبلوا القبلة بغائط ولا بول ولا تستدبروها ولكن شرقوا أو غربوا واتە: ئەگەر چوونە سەرئاو نە ڕوو لەقیبلە بکەن نە پشت . بەڵکو ڕوو لە رۆژهەڵات و ڕۆژئاوە بکەن

دووەم بـەدەسـتی چـەپ تـەرات بـکـە(إستنج باليسا)ردەستی چەپ بۆ پاکردنەوەی پیسی بەکاردهێنرێت پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم (إذا بال أحدكم فلا يأخذن ذكره بيمينه ولا يستنجي بيمينه ولا يستنجي بيمينه ولا يتنفس في الإناء)رواه الترمذي. واتە: ئەگەر کەسێک لە ئیوە چوو بۆ سەرئاو با دەستی راستی لە زەکەری نەدات،وەخۆی بەدەستی راستیش پاک نەکاتەوە, بەڵام ئەگەر عوزرێکی شەرعی هەبێت هیجی تێدا نیە ان شاءالله

سێیەم: خـۆپـاراسـتن لە پرشـیـکـی پـاشـەڕۆ(الإستتراه من البول)پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم ئاگاداری کردوینەتەوە کە خۆمان جوان لە پاشەرۆ پاک بکەینەوە چونکە هۆکارە بۆ سزای ناوِ گۆڕ . عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ( إِنَّ عَامَّةَ عَذَابِ الْقَبْرِ مِنَ الْبَوْلِ فَتَنَزَّهُوا عَنْهُ) وصححه الألباني في "صحيح الجامع" (3002) .واتە: خۆتان لە پاشەرۆڕ جوان

له پاشەرۆ پاک بکەینەوە چونکە هۆکارە بۆ سزای ناو گۆڕ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ( إِنَّ عَامَّةَ عَذَابِ الْقَبْرِ مِنَ الْبَوْلِ فَتَنَزَّهُوا عَنْهُ) وصححه الألباني في صحيح الجامع(3002)واتە: خۆتان لە پاشەڕۆڕ جوان پاک بکەنەوە چونکە زۆرینەی ئەو کەسانەی سزادەدرێن لەناو گۆڕدا بەهۆی جوان پاک نەبوونەویان یان خۆ پاک نەکردنەوە لەپاشەڕۆ

چوارەم: بەفیڕۆدانی ئاو نەگیراونەوە (الإهمال فی اغلاق صنابیر المیاه) پشت گوێ خستن بەفیرۆ دانی ئاو کارێکی نادڕوستە ئیمامی النووی (رحمه الله) دەفەرمووێت:(أجمع العلماء على النهي عن النهي عن الإسراف في الماء ولو في شاطئ البحر) واتە:زانایان یەک دەنگن لەسەر ئەوەی ئاو بەفیڕۆ دان کارێکی نادرووستە ئەگەر لە سەر کەناری ڕووباریش بێت

پێنجەم: قسە کردن لەناو ئاو دەست (الکلام فی الخلاء)قسە کردن لەناو ئاودەست کارێکی نا شیرینە دڕوست نیە ئیمامی النووی (رحمه الله) دەفەرمووێت:(وکذلک یکره الکلام على قضاء الحاجه بأی انواع الکلام )واتە: قسەکردن لەسەر ئاو کارێکی ناشیرینە بەهەر شیوەیک بێت

شەشەم: خۆپاک کردنەوە بە پشقل و ئێسقان (الإستنجاء ببعرة او عظم قەدەغکراوە خۆپاک کردنەوە بە پشقل ئێسقان جابری کوری عبدالله فەرموویەتی (أنّ رسولَ اللّٰهِ صلّى اللّٰهُ عليه وسلّم نَهَى أن يُستنجَى أو بعظمٍ) واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەهی کردووە لە خۆ پاکردنەوە بە پشقل ئێسقان

حەوتەم: دەست بە ئاو گەیاندن لەسەر رێگای خەڵکی (التخلی فی طریق الناس او فی ظلهم دروست قەدەغەلێکراوە لەسەر رێگای خەڵکی دەست بە ئاو گەیاندن (عن آبی هریرة آن النبي و قال آتقوا اللاعنین، قالوا: وما اللاعنان یا رسول الله؟ قال: الذي یتخلى في طریق الناس آو في ظلهم) روه مسلم واتە:خۆتان بپارێزن لەو دووشتەی دەبێتە هۆی نەفرەت لێکردن وتیان ئەی پێغەمبەری خوا صلى صلى الله علیه وسلم ئەو دووشتە چیە؟ فەرمووی: ئەو کەسەی لەسەر ڕێگای خەڵکی دەست بە ئاو دەگەینێ. یان سێبەرێک خەڵکی تێدا دادەنیشێت خۆپاک کردنەوە بە بەرد دروستە بۆ کەسێک ئەگەر ئاوەی دەست نەکەوت ئەواو بە سێ بەرد خۆی پاک بکاتەوە دایکی باوەڕداران عائیشە (ڕەزای

خوای لێ بێ )دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : (إذا ذهب أحدكم الى الغائظ فليذهب معه بثلاثه أحجار يستطيب بهن فإنما تجزۂ عنه) واتە: واتە ئەگەر کەسێک لە ئیوە چوو بۆ سەر ئاو با سێ بەرد لەگەڵ خۆی ببا خۆی پێ پاک بکاتەوە.بەڵام خۆ پاک کردنەوە لەسێ بەرد کەمتر قەدەغە لێکراوە

## فـەزڵ و گـەوەیی دەســت نـوێـژ

مـانـای دەســت نـوێـژ :الوضوء :أصل الكلـمه من الوضاء : الحسن والنظافه **لەزمانی عەرەبیدا** مانای پاکو خاوێنی پوختەییە. بەڵام لە شەرعی ئیسلامدا بە مانای شۆرینی ئەو ئەندامانیە کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووین

دەست نوێژ : بێگومان دەست نوێژ بەخشندەیی و نیعمەتی خوای گەورەییە بەسەر ئەم ئومەتەوە.چونکە بەئەنجامدانی چەندین خێرو چاکەیان دەست گیرۆ دەبێت وە چەندین تاوانیان دەسرێتەوە پلەشیان پێ بەرز دەبێتەوە فەزڵ گەورەیی نۆێژ گەلێک زۆرە لەوانیش

یەکەم: هۆکارە بۆ لێخۆشبوونی تاوان

دووەم: هۆکارە بۆ ناسینەوەی باوەردا لە ڕۆژی دوای

سێیەم: نیوەی ئیمانە

چوارەم: ڕێگایەکە بەروو بەهەشت

پێنجەم: پلەت پێ بەرز دەبێتەوە

## چۆنـیـەتی دەســت نـوێژ شـۆریـن بۆ نوێـژ

دەست نوێژ: مەرجێکی سەرەکییە بۆ قەبول بوونی نوێژ, وە هەر کەسێک دەست نوێژی نەبێت ئەوا نوێژەکەی قەبوڵ نیە. (عن ابن عمر رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم قال :" لاَ تُقْبَلُ صَلاَةٌ بِغَيْرِ طُهُورٍ) واتە: نوێژی هیج کەس قەبول نیە ئەگەر بە دەست نوێژوە نەبێت.

## یەکەم :نیەت هێنان

هاوەڵی خۆشەویست عمر بن الخطاب رضي الله عنه ، قال : سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول : ( إنما الأعمال بالنّيّات ،)واتە:هەموو کرِدەوە و پەرستشەکان بەپێ نیەتە ،بەڵام شوێنی نیەت لەدڵدا یە بەزووبان وتن بیدعیە داهێنراوە هیچ بەڵگەی لەسەر نیە

## دووەم: ناوی خوا هێنان التسمیە

پێویستە لەسەرەتای دەست نوێژ گرتندا (بسم الله)بکرێت،هاوەڵی خۆشەویست أبي هريرة رضي الله عنه قال:قال رسول الله صلى الله عليه و سلم :(لا وضوء لمن لم يذكر اسم الله عليه واتە: دەست نوێژی هیچ کەس تەواو نیە ئەگەر ناوی خوای لێ نەهێنێت

## سێیەم: شۆرینی هەردوو ناو لەپی دەست (غسل اليدين

پێویستە موسڵمان هەردوو ناو لەپی دەستی بشۆردرێت هاوەڵی خۆشەویست (الْمِقْدَامَ بْنَ مَعْدِي كَرِبَ الْكِنْدِيَّ ، قَالَ : " أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِوَضُوءٍ ، فَتَوَضَّأَ ، فَغَسَلَ كَفَّيْهِ ) شتێکیان بۆ پێغەمبەری خوا هێنا ئاوی تێدابوو جا دەست نوێژی گرت هەردوو دەستی شۆری



## چوارەم: سیواک کردن

سیواک کردن لەگەڵ دەست نوێژ سوننەتە (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهم عَنْهم أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَوْلا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي أَوْ عَلَى النَّاسِ لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ وضوء))واتە: ئەگەر لەسەر

ئومەتەکەم نارەحەت نەبوایە ئەوا فەرمانم پێ دەکردن لەگەڵ هەموو دەست نوێژێک سیواک بکەن

## پێجەم: ئـاو لـە دام ڕادان المضـمضـه

پێویستە لەکاتی دەست نوێژ گرتندا ئاو بکرێتە ناو دەم دەر بکرێتەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی ( إذا توضأت فمضمض )واتە:ئەگەر دەست نوێژت گرت ئاو لەدەمت ڕادە



## شەشەم: ئـاو لـە لـووت ڕادان الإسـتـنشـاق

پێویستە لە کاتی دەست نوێژدا ئاو بکرێتە ناو لووت پاشان دەربکرێتەوە. (عن أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عنهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلَّى اللَّه عليهِ وسلَّم قالَ: ((إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَجْعَلْ فِي أَنْفِهِ مَاءً، ثُمَّ لِيَنْتَثِرِ) واتە: ئەگەر کەسێک لەئێوە دەست نوێژی شۆری با ئاو بکاتە ناو لووتی دەری بکاتەوە.سوننەتە سێ جار ئەم کارە دووبارەکاتەوە



## حەوتەم: شـــۆریـنـی دەم چــاو غسـل الوجه

شۆرینی دەم چاو روکنێکە لە ڕوکنەکانی دەست نوێژ هەر کەسێک نەی شۆرێت دەست نوێژە  بەتاڵە خوای گەورە فەرموویەتی (فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ)سورە المائدە. واتە:دەم چاوتان بشۆرن. هاوەڵی خۆشەویست الْمِقْدَامَ بْنَ مَعْدِي كَرِبَ الْكِنْدِيَّ ، قَالَ : " أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِوَضُوءٍ .....غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاثًا

واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێک دەست نوێژی دەگرت سێ جار دەم چاوی دەشۆری

سوننەت وایە دەست بخرێتە ناو ڕیشەوە جوان ژێر جەناگەیش تەڕ بکرێت



## هەشتەم:شـــۆریـنـی هەر دووە دەســـت لەگـەڵ ئـانیشـکـەکان غسل الیدین الی المرافق

شـــۆریـنـی هەر دووە دەســـت لەگـەڵ ئـانیشـکـەکان روکنێکە لەروکنەکانی دەست نوێژ هەر کەسێک نەی شۆرێت دەست نوویژکەی بەتاڵە خوای گەورە فەرموویەتی(وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ)واتە: هەر دوو دەستان بشۆرن تا ئەنیشک تان. سوننەت سێ جار ئەم کارە دووبارە بکرێتەوە.(بِوَضُوءٍ.....غَسَلَ ذِرَاعَيْهِ ثَلَاثًا ثَلاثًا

واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێک دەست نوێژی دەگرت سێ جار  باڵێ دەشۆڕی

سوننەت لای راست پێش بخرێت







## نۆیەم:دەستـــی تــەڕ بەســـەردا هێنـــان مســـح الـــرأس

دەستـی تەڕ بەسـەردا هێنان روکـنێکـە لـە روکـنـەکـانی دەسـت نوێژی بەتاڵە خـوای گـەورە فـەرموویەتی وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ )واتە: دەستـی تەر بەسـەرتانان بێنن. وەدەبێت مەسح کـردن هەموو سـەر بگـرێتەوە واتە لـەپێشـی سـەروە تاکـو پشـتـی سـەر



## دەیەم: دەســـتـی تــەر بەســـەردا هێنــان مسـح الأذنین

پێویسـتـە هـەردوو دەسـت تەڕ بکـرێت پاشان مـەسـحـی هـەر دوو گـوێجکـەکـانی پـێ بکـرێت ."الأذنان من الرأس" واتە:پێغـەمبەری خـوا صـلـی الله علیه وسلم هـەردوو گـۆێ بەشـێکـە لـەسـەر



## یانزەیەم: شـۆرینی هـەردوو پـێ لـەگـەڵ قولـەپـێ غسـل الرجلین الـی الکـعبین

شـــۆرِینی هـەر دوو قـولـە پێیەکـان روکـنێکـە لـەروکـنـەکـانی دەسـت نوێژ هـەر کـەسـێک نـەی شـۆرێت دەسـت نوێژکـەی بەتاڵە خـوای گـەورە فـەرموویەتی(وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ)واتە:هـەردوو پێتان پشـۆڕن تاکـو قـولـە پێتان.هاوەڵی خۆشـەویسـت

الْمِقْدَامَ بْنَ مَعْدِي كَرِبَ الْكِنْدِيَّ ، قَالَ : " أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِوَضُوءٍ......وَغَسَلَ رِجْلَيْهِ رِجْلَيْهِ ثَلَاثًا ثَلَاثًا " .واتە: کاتێک پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەست نوێژی دەشۆری پییەکانی پییەکانی دەشۆری . پێویستە دەست بخرێتە ناو پەنجەکانەوە بۆ ئەوەی جوان تەر بێت

## پـاڕانـەوە دوای دەســت نوێـژ گـرتـن

أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاّ اللّهِ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنّ مُحَمّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ .اللّهُمّ اجْعَلْنِي مِنَ التّوّابِينَ وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهّرِينَ.اللّهُمّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاّ أَنْتَ, أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

واتە: (شایەتی دەدەم بەوەی، کە هیچ پەرستراوێک شایستەی پەرستن نییە، جگە لە (الله)ی تاکی بێ هاوەڵ، هەروەها شایەتی دەدەم بەوەی، کە بەڕاستی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) بەندە و نێردراوی خودایە) (خودایە بمگێڕە لە بەندە تەوبە کارەکان و بەندە خۆ پاککەرەوەکان)(خودایە پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ تۆ، شایەتی دەدەم بەوەی، کە هیچ پەرستراوێک شایستەی پەرستن نییە جگە لە تۆ داوای لێخۆشبونت لێدەکەم و بۆ لای تۆش دەگەڕێمەوە

## چـۆنییـەتی نـوێژی پێـغـەمبـەری خـوا صلی الله علیه وسلم

یەکەم ـ پێویستە رووبکرێتە کەعبەی پیرۆز

دووەم ـ پێویستە بە پیوە نوێژ بکرێت بۆ کەسێک توانای هەبێت

سێیەم ـ دانانی بەربەست

چوارەم ـ بوونی نییەت

پێنجەم ـ داپۆشینی عەورەت

شەشەم ـ سیواک کردن

## چونیەتی نوێژکردن

یەکەم ـ دابەستنی تەکبیری نوێژ بە الله أکبر

دابەستنی تەکبیری الله اکبر روکنیکە لە روکنەکانی نوێژ هەر کەسێک نەیلێت بەزووبان نوێژکەی بە تاڵە ئەگەر بیری بچێت.پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی (إنه لاتتم صلاة أحدكم حتی .... ثم یكبر الله)واتە:نوێژی هیج کەسێکتان تەواو نیە....تاکو نەڵێت (الله اکبر)سونەتە هەردوو دە ستی تاکو ئاستی شانەکانی یان گوویەکانی بەرزکاتەوە





## شێوازی ڕاست لە کاتی وەستاند




## شیوازی ڕاست لە کاتی قاچ دانان



## دووەم ـ جۆنـیـەتی دەســت گــرتــن لە نــوێــژدا

پێویستە دەستی راست لەسەر دەستی چەپ دابنێریت وە لەسەر سنگ رابگرێت.هاوەڵی خۆشەویست وائل بن حجر رضي الله عنه قال : صليت مع رسول الله صلى الله عليه وسلم ووضع يده اليمنى على يده اليسرى على صدره.واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژم دەكرد جا دە ستی راستی لە سەر دەستی چەپی دادەنا

## سێیەم ـ دوعــای دەســت پێكردنــی نــوێــژ

كاتێک كە االله اكبر یەكەم كرا پێویستە ئیسانی موسڵمان كۆمەڵێک دوعا هەن بیان كات كە هەموو یان سوپاس ستایشی خوای گەورەیی تێدا بكرێت وە كۆمەڵێک دوعای زۆر هەن بەڵام بەداخەوە موسڵمان بێ ئاگان لەو دوعایە كە پێش فاتیحە دەخوێندرێت یەكێک لەو دوعایانە زۆر ئاسان.(الحمد لله حمدا طيبا مباركا فيه

## چوارەم ـــ خوێنـدنی ســوره فاتیـحە لەهــەمــوو ڕكاتێكدا

خوێندنی سوره (فاتیحە)روكنیكە لە روكنەكانی نوێژ هەر كەسێک نەخوێنێت نوێژكەی بەتاڵە.هاوەڵی خۆشەویست عبادة بن الصامت:دەفەرمووێت. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی (لا صلاة لمن لم يقرأ بفاتحة الكتاب).واتە نوێژی هیج كەس قەبووڵ نیە ئەگەر سورەتی فاتیحەیی تێدا نەخوێنێت

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ (1) الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (2) الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ (3) مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ (4) إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ (5) اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ (6) صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ (7)) سوننەت بەسەوتی بەرز ئامین بكرێت كاتێک ئیمام بەرنوێژی كرد

## پێنجەم ـ رکــوع بــردن

رکوع روکنیکە لە روکنەکانی نوێژ هەر کەسێک  ئەنجامی نەدات نوێژکەی بەتاڵە.خوای گەورە فەرمووویە تی (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا)سورە الحج. واتە: ئەی ئەوانەی باوەرتان هێناوە کرنوش بەرنن. پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی:(إذا قمت الى الصلاة ثم اركع حتى تطمئين راكعا) واتە:ئەگەر ئەگەر هەستان بۆنوێژ.... ئەوا رکوع بەرن تێدا بمێنەوە.  وە پێویستە بەهەردوو دەستەکانت ئەژنوکانت بگریت(إذا ركعت فضع راحتيك على ركبتيك، ثم فرج بين أصابعك.)واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی ئەگەر رکوع تان برد  ئەوا ناو لەپەکانت لەسەر ئەژنۆکانت دابنێ پەنجەکانت لەیەک جیا بکەوە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: گەورەیی بۆ خوای گەورە دەربرنن وەسوننەتیشە سێ جار لە رکوعدا بڵێیت {سبحان ربي العظيم } و{سبحان ربي العظيم وبحمده} هە ردوکیان سوننەت هەریەکیکیان بووترێت کێشەی نیە والله اعلم



## شەشەم ـ راست بوونەوە لە رکوع بردن

راست بوونەوە لە رکوع روکنێکە لە نوێژ هەر کەسێک ئەنجامی نەدات ئەواو ئەو نوێژەکەی بەتاڵە. پێغەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی (إذا قمت الى الصلاة .... ثم ارفع حتى تعتدل قائما)واتە ئەخوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی:(إذا قمت الى الصلاة ثم اركع حتى تطمئين راكعا) واتە:ئەگەر هەڵسان بۆ نوێژ..... باشان هەڵبسنەوە تاکو پشت رێک دەبێتەوە. واتە رێک ببەوە سوننەتیشە لەگەڵ پشت رێک بوونەوەدا هەردوو دەست تاوک شانەکانت یان گۆێجەکانت بەرز بکرێتەوە ئەم دوعایە بخوێنرێت. (سِمعَ اللّهِ لِمَنْ حَمِدَهُ - رَبّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ, حَمْدًا كَثِيرًا طَيّبًا مُبارَكًا فِيه





## حەوتەم ـ سووژدە بردن

سووژدە بردن روکنێکە لە نوێژ هەر کەسێک ئەنجامی نەدات ئەواو ئەو نوێژەکەی بەتاڵە.خوای گەورە فەرموویەتی( يَا أَيُّهَا الّذِينَ آمَنُوا .....وَاسْجُدُوا )واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە سووژدە بەرن بۆ خوا لە نوێژدا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی (إذا قمت الى الصلاة .... ثم اسجد حتى تطمئن ساجدا)واتە:ئەگەر هەستای بۆ نوێژ ......پاشان سووژدە ببەو پاشان تیدا بمێنەوە تاکو لاشە بە تەواوی لە جوڵە دەکەوێت هاوەڵی خۆشەویست ( ابْنِ عَبّاسٍ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا قَالَ قَالَ النّبِيُّ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ:" أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ عَلَى الْجَبْهَةِ وَأَشَارَ بِيَدِهِ عَلَى أَنْفِهِ وَالْيَدَيْنِ وَالرُّكْبَتَيْنِ وَأَطْرَافِ الْقَدَمَيْنِ )واتە: فەرمانم پێ کراوە سووژدە بەرم لەسەر حەوت ئەندام (ناوچوانن. بەدەست ئیشارەتی بۆ

لووتی کرد هەردوو دەست،وە ناولەپ،وە ئەژنوکان،وە لێواری پییەکان. سونەتیشە سێ جار ئەم دوعایەلی بکرێت سبحان ربي الأع





## هەشتەم ـ پشت راست کردنەوە لەسووژدە

پشت راست کردنەوە روکنێکە لە نوێژ هەر کەسێک ئەنجامی نەدات ئەواو ئەو نوێژەکەی بەتاڵە هاوەڵی خۆشەویست (أبي مسعود الأنصاري البدري قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم لا تجزئ صلاة لا يقيم فيها الرجل يعني صلبه في الركوع والسجود)واتە:نوێژی هیچ کەس تەواو نیە ئەگەر پشتی لە دوای سووژدە راست نەکاتەوە.سونەتیشە سێ جار بووترێت (ربی اغفر لی ابی اغفر لی)وە کومەڵێک زیکری تریش دەتوانن لەقەلای مسڵمان سیری بکەن

## نۆیەم ـ دانیشت بۆ تەحیات

دانیشت بۆتەحیات روکنێکە لە نوێژ هەر کەسێک ئەنجامی نەدات ئەواو ئەو نوێژەکەی بەتاڵە.سونەت لەسەر پێ چەپ دابنیشت پەنجەکانی پێ راست بچەقێنیەت سەرزەوی.بەڵام بۆ تەحیاتی چوار رکاتی پێ چەپ دەر دەکرێتە دەرەوە وە بەم شیوەیە تەحیات دەخوێنیت

التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ, وَالصَّلَوَاتُ, وَالطَّيِّبَاتُ, السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ (1) وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ, السَّلامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)وە لەتەحیاتی دووەم ئەمەی بۆزیاد





دەکەیت(اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيد)پاشان سەلام دەرێتەوە بەلای راست وچەپدا دەوترێت (السلام عليكم ورحمه الله)هەردوو لادا بەدەنگی بەرز







## ئەوشتانەی نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە

یەکەم ـ پێکەنین

دووەم ـ ئەنجام نەدانی پایەیەکی نوێژ

سێیەم ـ قسەکردن

چوارەم ـ تێ پەڕبوونی گوێ درێژ بەبەردەم نوێژدا

پێنجەم ـ تێ پەڕبوونی ئافرەتی بالغ بوو بەبەردەم نوێژدا

شەشەم ـ تێ پەڕبوونی سەگی ڕەش بەبەردەم نوێژدا

حەوتەم ـ هەرشتێک لە پاش پێشەوە دەر بچێت

## قەدەغە لێکراوەکانی نوێژ

یەکەم ـ چاو نوقاندن

دووەم ـ پاکردنەوەی شوێنی سووژدە

سێیەم ـ دەست گرتن لەخوار ناوکەوە

چوارەم ـ سیرکردنی ئاسمان

پێنجەم ـ ئاوردانەوە یان لاکردنەوە

شەشەم ـ باوێشک دان

حەوتەم ـ ڕاخستنی ئانیشەکان لە سووژدە

هەشتەم ـ جوڵاندنەوەی زۆر

نویەم ـ پۆشاک بەسەر شاندا

دەیەم ـ لەبەرکردنی پۆشاکی تەنک

یانزەیەم ـ ڕۆشتن بە بەردەم نوێژدا

## ڕێـگـە پێـداراوەکـانی نـاو نـوێژ

یەکەم ـ چوونە پێشەوە لەکاتی پێویست دا

دووەم ـ کوشتنی مار و دووپشک

سێیەم ـ هەڵ گرتنی منداڵ

چوارەم ـ وەڵام دانەوەی سەلام بە ئاماژە کردن

پێنجەم ـ راست کردنەوەی هەڵەی ئیمام

شەشەم ـ گریان

حەوتەم ـ قەدەغکردنی کەسێک بە بەردەم نوێژدا بڕوات

تێبینی هەموو ئەوانەی باس کران فەرقی نیە بۆ پیاوان و ئافرەتان لەکۆتایدا لەدوعای خێر بۆ بەشمان مەکەن وصلی الله علی نبینا محمد وعلی آلە وصحبە وسلم

ئامادەکردنی بیلال سەرکەوت

پێداچونەوەی مامۆستا حیکمەت

دیزاینی بەرگ سوڵتان محمد